کۆماری عێراق

ئەمیندارێتی گشتی رۆشنبیری و لاوان

# دیوانی بێسارانی

١٠٥٣ - ١١١٣ هـ.ق

١٦٤١ - ١٧٠٢ ز

بەرگی یەکەم



کۆکردنەوە و، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە

کیومرث نیک رفتار

# دیوانی بێسارانی

١٠٥٢ - ١١١٣ ھ.ق.

~~١١١٣ - ١٠٥٣~~ ھ.ق

١٦٤١ - ١٧٠٢ ز

~~١٧٠٢ - ١٦٤١~~ ز

بەرگی یەکەم

کۆکردنەوە و، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە

کیومرث نیك رفتار

«ناوەرۆك –

| باس | لاپەڕە | ژمارەی شیعرەکان |
| --- | --- | --- |
| پێشەکی | | |
| بێسارانی ، لە چەند لاپەڕەیەکدا . | ٩ | – |
| پێشەکی | ١٤ | |

## تیپی «أ»

# تیپی – ب –



# تیپی – پ –



# تیپی – ت –

## تیپی – ج –



## تیپی – چ –

# «بێسارانی لە چەند لاپەڕەیەکدا»

پیرێکی دانا ، مەلایەکی زانا ، دڵی ئاوێنەی چیاکانو فیکری بەرزی – ئەلکتریکی بەندەنەکان ، شەیدای ئاسمانی هەورامانو شابازی کلاوەی بێساران ، مامۆستای ئەدیبانو ڕەنگرێژی شاعێران ، دڵی کراوەتەوە بە ئیلهامێکی یەزدانی ، بوە بە هێلانەی ئەدەبیاتی گۆرانی ، هێندێ جار مەیگێری مەیدانی - خاس خواکان بوە .

سەرچاوەی خەیاڵی وردی ، کانی گەشاندنەوەی گیان ، باخچەی گەوهەری ئەدەبیاتی گەلێ بەهێزتر لە ئاوو نان ، چونکە ئەم دوانە ، تەنیا بۆ ژیانن ، بەلام ئەو دوانە ، کورۆکی ژیان .[1]

سوتاوێ کە بۆ پیروزی دەروونی هەڵقرچاوی ، پڕ لە بۆنی ژیانبەخشی – عەشقو عێرفانە ، لە دێی بێساران» ، ناوچەی «ژاوەرۆ» ،[2] لە ماڵێکی ساحیب – فەزیلەتو زانست وە لە بنەماڵەیەکی ئاینیی ، هاتوەتە دۆنیاوە .

چاوی باوکی «مەلا قطب الدین» ، ناوبانگ بە «عەرەب» ، بەدیتنی ئەو – ڕووناکو ڕووناکتر بوەتەوە . ئەم ڕێککەوتە لە نیوەی دووەمی سەدەی – یانزەهەمی کۆچی مانگیدا ، بوە « =١٠٥٣[2] هـ .ق – ١٦٤١ز) .

مەلا قطب الدین» بەهۆی شارەزاییکی تەواو و ، دەستێکی هەرە درێژ – کە لە زمانی «عەرەبی»دا ، کە لەو کاتەداو لەو ناوچەیەدا ، تەنیا عیلمی ئەو سەردەمەی حۆجرەی فەقیان بووە ، بویەتی ، بە « عەرەب » ناوبانگی دەرکردوە .

---

(١) مێژوی ئەدەبی کوردی ، مامۆستا علاء الدین سجادی ، چاپی دووەم ، لاپەڕەی ٢٠٥ .

(٢) «ژاوەرۆ» ناوچەیەکە لە بەینی «هەورامانی تەخت» وە «گاوەرۆ» ، دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بە شێوەی «هەورامی» قسە ئەکەن .

ئەم ناوچەیە ، لە بارەی هونەرو ئەدەبی کوردیەوە زۆر پڕبارە ، بەلام بە داخەوە زۆربەی شاعیرەکانو زاناکانی ئەم ناوچەیە ، تا ئێستاش نەناسراو ماونەتەوە .

«مەلا قطب الدین» ـ [3] ناوی کورەکەی بەحوکمی «قۆرعە» ، نایە «مصطفی» ، لەو کاتەدا ، بە گوێرەی ڕەسمو یاسای بنەماڵەیی و ، دابی عەشایری ، وابو – کە کوران ئیش و کارو پیشەو هونەری باوکو باپیرەیان بگرن بەدەستەوەو ، نگاداریشی لێوە بکەن ، لەسەر ئەم

---

(٣) بە پێی لێکۆڵینەوەی زانای بەڕێز ، جەنابی (سید محمد طاهر هاشمی) . بنەماڵەی قاضی جوانرۆ . کە ئێستاش «مەلا عەلی فخری» قاضی جوانرۆ وە «مەلا احمد فخری» . مۆدەرێسی دێی یاریٚ لە ناوچەی جوانرۆ لە پاشماوەی ئەم بنەماڵەیەن . خۆیان لە ئەولادی «مەلا مصطفی بێسارانی» . دەزانن .

لەم بنەماڵەیە . خوا لێ خوش بوو . زانای بە ناوبانگ «مەلا محمد»ی قاضی جوانرۆ کە تا دەوروبەری ساڵی ١٢٩٠ هـ .ق . لە ژیاندابوە . خۆی بە ئەولادی «مەلا مصطفی بێسارانی» زانیوە وە ئەمەش بەپێی «نەسەب نامە»یەکە . کە «مەلا محمد» قاضی جوانرۆ بەدەستی خۆی نووسیوەتی وە لە پەرتووکێکی بلاونەکراوەدا کە لەلای جەنابی «سید محمد طاهر هاشمی» مەوجودە . ئەوتریٚ .

ئەو «نەسەب‌نامە»یە بەم جۆرەی خوارەوە تۆمار کراوە :

«مەلا محمد قاضی» کوڕی «مەلا محمود» کوڕی «مەلا مهدی» کوڕی «مەلا هادی» کوڕی «مەلا قاسم» ، کوڕی «مەلا مصطفی بێسارانی» . کوڕی «مەلا قطب الدین عرب» کوڕی «مەلا شمس الدین» . کە بەپێی ئەم «نەسەب‌نامە» . ناگونجیٚ جیاوازی نێوان «مەلا محمد قاضی جوانرۆ» وە «بێسارانی» کەمتر لە سەدو هەشتا ساڵ بێت (– ١٢٩٠ هـ . ق) مەلا محمد قاضی جوانرۆ لە حەیاتا بوە . کە ئەگەر لەم تەئریخە . ١٨٠ ساڵ کەم بکرێت . ساڵی ١١١٠ هـ . ق پێك دێت کە لە هەمان کاتدا . بێسارانیش زیندو بوە وە ئەم لێکۆلینەوەشە . هەمیسان لەگەڵ لێکۆڵینەوەی «مامۆستا علاء الدین سجادی» دا ، بە پێی بەڵگەی زیندوی ناوبراو . ڕێك ئەکەویٚ .

مامۆستا سجادی لە کتێبە زۆر بەنرخەکەیدا . (= مێژوی ئەدەبی کوردی» ، لاپەرەی ٢٠٦ چاپی دووەم ساڵی ١٩٧١ ز – نووسیوەتی : «مەلا مصطفی» کوڕی «مەلا احمد»ی بێسارانی‌یە . وە ئەم سەرچاوەیە لەساڵی ١٩٥٣ ز – تا ئیستا . تەنیا بەڵگەی باوڕپێ کراوو بلاوکراوە لەبارەی بێسارانیەوە بوە . بەم بۆنەوە ئەو کەسانەی کە خویان لە مێژوی ئەدەبی کوردی . ئەمەیان خوێندبێت یاخود لە جێگای ترەوە . کە ئەویش هەر لەم کتێبە . وەر گیراوە . ئێستاش ئەم قەولە بەزانستی خۆیان لە بارەی بێسارانیەوە . زیاد دەکەن .

دوور نیە لە داهاتوودا ، تەواوی ئەو قوژنە تاریکانەی ژیانی ژمارەیەکی زۆر لە شاعێرو هونەرمەندەکانی کوردمان بۆ ڕوون بێتەوە . ئینشاء الله .

ڕەوشتە ، «مصطفى»ش بە دوای – فێربوونی خوێندنەوەو نووسینەوەی سەرەتایی ، کە بەهۆی خوێندنەوەی – «تۆمار» وە لە سەر نووسینی ، پێك دەهات ، لە پاشا ئەچێتە حۆجرەی – فەقیان کە لەم خولەدا ، زۆربەی حۆجرەکانی ئەو ناوچەیەی چاو پی کەوتوە ، لە «نۆدشە» ، «پایگەلان» ، «بێساران» ، وە « شاری‌سنە» ، (فەقێتی‌ی) کردووە ، زۆرتر لە پایگەلان ماوەتەوە ، ئیجازەی مەلایەتی‌ی ، لە «سنە» وەرگرتوە و ، گەڕاوەتەوە بۆ «بێساران» و لەوێ دەستی (بەدەرز) ووتنەوە کردوە .

مامۆستا بێسارانی کە بی گۆمان یەکێ لە گەورەترین پیاوە ئایینەکانی کوردەوریە کەزەمیرێکی ڕووناکی هەبوە ، وە بەم بۆنەیەوەو بەهۆی زانستو شاعیریشەوە زۆر ناوبانگ بوە ، بەلام بەداخەوە چۆنیەتی (بەسەرهاتو) ژیانی‌ی ، وەکوو زۆربەی شاعێرو – زاناو عارفە کوردەکانی کە ، هێشتا لە تاریکی‌دا ، ماوەتەوە .

بێسارانی مەلایەکی زۆر بالا دەست بووە ، زۆربەی شاعیرەکانی هاوکات و هاتوو بەدوای ئەودا ، «بێسارانی» یان بە مامۆستایەکی زور گرنگو زانا ، ناوبردوە . بە تایبەت مامۆستای پایەبەرز «مەولەوی» .

برێ کەس ووتویانە «بێسارانی» و «باباشیخ»ی بێساران ، هاوکات – بوون ، بەلام بەلگەیەکی باور پی کراویان بەدەستەوە نیە . هەرچەند کە ئەگونجێ ڕاست بێ .

مامۆستا بێسارانی لە عیلمی «أصول»دا ، دەستێکی (بالای) هەبوە ، لەگەل ئەوەشا کە شاعیرێکی غەرامی‌و فەلسەفەچیەێکی ئایینی ئەناسرێ ، ساحیبی شعورێکی پاك وە هەستێکی بەرزیش بووە . گەلێ لە شاعیرە بەرزەکان ، لە لای ئەو دەرسیان خوێندوە وە ئیجازەیان وەرگرتوە .

بێسارانی پیاوێکی زور شۆخو قسەخوش‌و دەم بە پی کەنین بوە وە هەروەها لە هۆنراوەکانی دەرئەکەوێ ، خاوەنی فیکرێکی ورد ، دڵێکی ناسك وەهەستێکی بەتین‌بووە .

دوور نیە لە عیرفاندا ، «ڕوەشتی خەلوەتیە»ی کە لەو ڕۆژەدا ، لە کوردستانی ئێرانا ، باو بوە ، بۆ خۆی دەست‌نیشان کردبێت . باوەکوو عاشق – کچێك بەناوی «ئامینە» کە کچی پیاوێك بەناوی « شێر محمد» ی‌پایگەلانی‌یە ، ئەبێت ، وە بی گۆمان ئەم کچە توانیویەتی بەشێکی زۆری لە سەرچاوەی هەلقولێنی لە شیعری بێسارانی‌دا ، ببێت ، لەگەل ئەمەشدا ، ئەلێن ، بێسارانی هەرگیز ژنی نەهێناوە .

شیعرەکانی بێسارانی ئەگەر بە قوولی بەرچاو بدرێت ، ئەتوانین لای‌کەم ، بە سێ بەشی

جیاواز ، دابەشی بکەین ، کە بریتین لە :
غەرامی ، عیرفانی ، کۆمەلآیەتی .
بەشی یەکەم کە زۆرتری شێعرەکانی بێسارانی ئەگرێتەبەر ، زۆربەی هی دەورانێکە کە بێسارانی گەنج بوە ( = خولی فەقێتیێ‌ی وسەرەتای مەلایەتی) .
ئەم بەشە ، هەمیسان ، خۆی بە دوو بەشی جیاواز ، دابەش‌ئەکرێت :
بەشی هەوەلێ شموولی ئەو هەڵبەستانە ئەکات کە بێسارانی لەلای خۆشەویستەکەی ، شیرینەکەی ، شۆخەکەی ، قیبلەکەی ، نیازەکەی ، ئاواتەخوازەکەی‌یان بە ووتەی خۆی « چراغ - چراخ» ، بەبێ تەنگوچەڵەمەیەکی زور ، دانیشتووبوە .
چاو ، برۆ ، برژانگ ، خەت‌و خالێ ، کوڵم‌و لێو ، زوڵف‌و بەژن‌و بالآ ، سەیر ئەکات‌و دەم بە تاریف‌و قەڵەم بەنووسینەوە خەریك ئەبێت .
بەشی دووەم بەلآم ، بە رواڵەت دوور لە «چراغ»ە وە سەدان - تەنگو چەڵەمە ، زۆخ‌و زام ، دەردو برین ، غەم‌و پەژارەو هێجران ، لێ‌ی کۆبوەتەوە ، و لە دەروونی‌دا ، تۆفانی غەم‌و هێجران ، شەپۆل بە سەر شەپۆل - دەهێنێت .

بێسارانی عاشقی سرۆشتە ، بە تایبەت دیمەنە جوانەکان ، چیا بەرزەکان ، تافگە کافوریەکان ، گوڵە هەزار رەنگەکانی شاخی هەورامان ، رەزە میوەکان جێگایەکی دیاری‌یان ، لە شێعرە غەرامیەکانیا ، هەیە .
لێرەدا دەست‌نیشان کردنی سێ نموونە لە هەڵبەستەکانی مامۆستا بێسارانی کە بتوانێت رێ‌نموونیەك بێت لە بۆ خوێنەری ئازیز ، رەنگ‌بێ ، بێ‌سوود نەبێ :

أ - **نمونەی غەزەلی غەرامی :**

چـــــراغ وەنـــــەوشە ،چـــــنور چـــــەنی‌ی گولێ
عـــــەزمێ رای وسالێ ،تۆشان هـــــانـــــەدلێ
چـــــنور جـــــەسەرکۆ ، وەنـــــەوشە جـــــەچـــــەم
گولێ جـــە گوڵستـــان ،وە هـــەم بـــیـــەن جـــەم (تـــاد . . .)

**ب – نموونەی هەڵبەستی عیرفانی :**

تەرسا بەردەنم ، تەرسا بەردەنم
راسەن سۆخیرەی دەیر تەرسا بەردەنم
مەی نەپای مەمبەر . مەسجێد وەردەنم
تەجدیدێ مەزهەب ، عیسا کەردەنم (تاد . . .)

**ج – نموونەی شیعری کۆمەڵایەتی :**

ئارۆ وێنەی . دیم خەزانیٚ زار
بەندیٚ بەزامەت ، جەورو جەفای یار
ئەوجە دەردیٚ وێش . بێ مەدارایٚ
خارچنگیٚ زامەت ، لێش‌و یارا بیٚ (تاد . . .)

«بێسارانی» . لە ساڵی ۱۱۱۳ هـ . ق بەرانبەر لەگەڵ ۱۷۰۳ ز ، لە تەمەنی ٦۱ ساڵێدا کۆچی دوایی کردوە وە لە گۆڕستانی «پیرە هەژارە» کە ئەکەوێتە ۳ کیلۆمەتری ڕۆژئاوای «محمود ئاوای دوو ڕۆ» . واتە بەینی «تەرخان ئاوا» ، و «محمود ئاوا» ، نێژراوە .

ئەم گۆڕستانە ئێستا کەوتوەتە لای خوارووی ئەو جادەیە کە لە سنەوە ئەچێت بۆ مەریوان .

کیومرشا عبد الغفور (نیك رفتار) – سلیمانیه
۱۳٦۰/۳/۲۸ هـ . ش – ۱۹۸۱/٦/۱۸ ز

## «پێشەکی»

خوێنەری بەڕێز ،

دیوانێ کە هەر ئێستا بەدەستتەوەیە ، هی هۆنەلەیکی نەمر ، زانایەکی فیکروردو مەلایەکی قسە خۆشە ، کە خاوەنی دەروونێکی خاوێن بووە ، خەڵکی دێی «بێساران»ە ، لە ناوچەی «ژاوەرۆ» ناحیەی «سەڵو ئاوا = سرو اباد» شارەستانی «مەریوان» ، پارێزگەی «کوردستان»ی ئێران .

ناوی «مصطفى بێسارانى» یە ، ناوبانگی دەرکردوە . «نازناوی» شی «بێسارانی»ە . بەڵام بە پێچەوانەی زۆربەی شاعیرەکان کە «ناوی شیعری» خویان لە هەڵبەستەکانیاندا ، دێنن ، بێسارانی ، ئەم عورفەی کەمتر بەرچاوگرتوە ، بەم بۆنەوە شیعرەکانی مامۆستا بێسارانی ، زۆرجار بەناوی شاعیرانی ترەوە ، لە ڕادیو خوێنراوەتەوە ، یان لە نوسخە دەسنووسەکاندا یاخود برێ جاریش لە چاپەمەنیەکاندا ، نوسراوە ، یان ، دەم بەدەم نەقڵ ئەکرێ . تەنانەت بەپێچەوانەی ئەمەش ، هەر پێش‌هاتی کردوە کە شیعری کەسی‌کی کە بەناوی بێسارانیەوە بلاوکراوەتەوە . لێرەدا ، ئەڵبەتە ، تەنیا ئەوانەی دەتوانن ئەو تەشخیصەیان بێ . کە شیعرناس بن وە لەم بابەتەوە لێکۆڵینەوەیان بووبێت .

کۆکەری ئەم دیوانە ، چەندەها ساڵە (لە ١٣٤٠ [1] هـ . ش – ١٩٦١ ز – تائێستا) لە فرسەتە مناسبەکاندا ، خەریکی کۆکردنەوەی شیعرەکانی ئەم شاعیرە پایە بەرزەو (هەندێ) شاعیرانی نەناسراوی تری کورد بووم .

هیوام ئەوە بوەو هەیە : بە هیمەتی ئەدەب پەروەرانی کوردو فەرهەنگ ناسانی دڵسۆزەوە ، لە هەرکوێ ئەژین و لە هەر پلەیەکدا هەن ، ئەم دیوانەو باقی دیوانەکانی تر ، بە شێوەیەکی پەسەندکراو ، لە تەواوی قۆناغەکاندا (=کۆکردنەوە لە سەر نووسینەوە ، ڕاستکردنەوە ، لێکۆڵینەوە ، چاپ ، بلاوبوونەوەو . .) ، تا گەیشتن بە دەستی خوێنەرە ئازیزەکان ، بە چەشنێ کە بتوانێ تا ڕادەیە ، ڕەزامەندی ئەوان ، بەدەی بێ‌بنێت ، ئامادەبکرێ ، جا لەم ڕێبازەدا ، چاوەڕوانی ئەوە ناکەم کە کەسێ منەتم بزانێ یاخود سوپاسم بکات ، بەڵکوو بە پێچەوانەوە ، بە ئەرکی سەرشانی خۆمی دەزانم ، ئەو ئیشەی کە لەم بابەتەوە لە دەستم دێت ، بە هەر قیمەتێك بێت ، ئ‌ی‌کەم .

---

(١) لە ئێراندا ساڵی کۆچی هەتاوی بەکاردەهێنرێت کە ٣٦٥ رۆژە (هـ .ش) . بەڵام لە عێراقدا ساڵی ی کوچی مانگی کە ٣٥٥ ڕۆژە .

لە پەیوەندی لەگەڵ ئەمەدا ، بە واجبی خۆم دەیزانم ، بەر لە هەموو شتێك ، لە ماموٚستای پایە بەرزو بەرێز ، جەنابی «سید محمد طاهر هاشمی» کە عینایەتیان فەرموو ، بەشێ لە چوێنەتی ژیانی بێسارانییان بە پیٚنووسی خوٚیان بەخەطێکی هەرە جوان ، بوٚ ناردووم ، لە کانگای دڵەوە ، سوٚپاسیان بکەم .

هەروەها لە جەنابی «سید رضا شهیدی» ، سوٚپاس ئەکەم ، کە بە سەفاوەتێکی تەواوەوە ، لەم بارەوە ، یارمەتیان داوم .

لە برایانی ئازیز کاکە «حارس عبد القادر هەورامانی و علی محمود» بە بوٚنەی نووسینەوەی دیوانەکە لەسەر شێوەی رێنووسی «کوردی» سوٚپاس ئەکەم .

خوینەری بەرێز ، هەروا کە دەزانیی ، هەموو ئیٚشێکی نویٚ ، هاوریێیە ، لەگەڵ هەندێ کەمو کوٚریو ناتەواویدا ، کەوا بوو ئەم دیوانەش کە هەوەڵین تەجرەبەی منە بە تایبەت ئەم بەرگی یەکەمە ، لەو یاسا گشتیە ، ناتوانیٚت جیاواز بیٚت .

لێرەدا ، نامەوێ بڵێم لە ناتەواویەکانو کەمو کوریەکانی ئەم بەرگە ، چاوپوٚشی ، بکەنو لەسەری مەچن ، چونکە ئەم شێوەیە ئەبیٚتە هوٚی وەستانو ئیش نەکردنی فیکری ئەدەبی . جگە لەمەش ، زیانی گەورەی ئەوەیە کە رەواج بازاری تجارەتی ئەدەبی کوردی ئەدات ، بەڵکوو بە پیٚچەوانەی ئەوە ، تکایە لە کەمو کوریەکان وردبینەوە ، دڵسوٚزی بەکار بهیٚنن وە بیانخەنە بەر نەقدو پرسیارو لێکوٚڵینەوە ، تا رێرەوانی ئەم رێگەیە کەمتر بە هەڵەدا بچن ، چونکە خوێنەر ئاوێنەی تەواو قەدی (بالاجامی) ، نووسەرە .

ئەمەو بە تایبەت ، لە بارەی «بەرگی یەکەم»ی ئەم دیوانەوە ، تکاتان لیٚ ئەکەم بیرورای خوٚتان راگەیەنن ، تا لە بەرگی دووەم ، دا ، سوودی لیٚ وەرگیرێ وە هەروا لە باقی دیوانە شیعرەکانی ، شاعیرانی تر ، کە بە دەستەوەن ، لە بەر چاو بیٚت .

بە هیوای هاوکاری ، ئیٚتر سوٚپاس

سلیمانیە – کیومرث عبد الغفور (نیك رفتار)
١٩٨١/٦/١٨

## «تپی لا»[١]

ئیم شەو دڵ جـــــــــــــــــــــــــە دەرد .
تـــــاسۆب سپی بی ، دڵ نـــــــالاً جـــــــە دەرد[٢]
پـــــەیوەست مــــەکــــێشاش ، هـــــەنـــاسانیٚ سەرد
هــــەر سەنگ‌و ئـــــاهـــــەن . پـــــەیش مــــەبی وە گەرد[٣]
واتم هـــــــــــــــەی دڵە وەسەن ، وەس نـــــــــــــاڵە
خــــــەڵکــــــان جـــــــە نــــــاڵەی تۆ شان شی زا ڵە[٤]
مــــــاچۆ بیٚ مــــــــرووەت ، چ یـــــــاد کــــــەردەنی
چــــــەنی مـــــــە ئــــــاڵوون ، مــــــــەر بیٚ دەردەنی[٥] ؟
جـــەی وەرتـــەر قـــیـبــلـــەم ، هــــەر شام ، هــــەر سەحــەر
مــــەغــــانــــاش بــــالاً ، قـــامـــــەت چون عـــەرعـــەر[٦]

---

(١) دڵ لە دووری دۆستەکەی بەکوڵ ٣ هەر لە ئێوارە تا بەرەبەیان . دەناڵێنیٚ‌و «بێسارانی»ش لۆمەی دڵ دەکا :

(٢) جە : لە . سۆب : بەیانی . بی : بوو . نالاً : ناڵاندی . واتە : (ئەمشەو) تا بەرەیان . دڵ هەر ناڵاندی .

(٣) پەیوەست : بیٚ‌وچان . مەکێشاش : هەڵی ئەکێشا . سەنگ : بەرد . ئاهەن : ئاسن . پەیش : لەبۆ ئەو . مەبی : ئەبوو . گەرد : تۆز . واتە : دڵ بەبیٚ‌و چان . هەر هەناسەی سەردی هەڵ‌ئەکێشا . بەو شێوەیە کە تەنانەت بەردو ئاسنیش پیٚ‌ی ئەبوو بە تۆز .

(٤) واتم : گۆتم . ووتم . وەسەن : بەسە . خەڵکان : مەردم . تۆشان : تۆیان . شی : چوو . واتە : بە دڵم گۆت دەبە . بەس بناڵێنە . ئەو خەڵقە بە دەس ناڵەی تۆوە ، زاڵەیان چوو .

(٥) ماچو : گۆتی . چ یادکەردەنی : چی‌یت بیرکردووەتەوە . چەنی : چۆن . نەناڵوون : نەناڵم . مەر : مەگەر . وەڵامی دامەوەو گۆتی ، چی‌یت بیرکردووەتەوە . چۆن دەتوانم نەناڵێنم . مەگەر تۆ قەت . ئازارت بە خۆتەوە نەدیوە ؟

(٦) وەرتەر : پێش‌تر . قیبلەم : دۆستەکەم . هەر : هەموو . شام : ئێوارە . سەحەر : بەیانی . بەناناش : ئەی‌نواند . چون : وەکو . عەرعەر : دارێکی سافوو بەژنوو بالاً خوشە . واتە : لەهەموپیش‌تر . هەموو ئێوارەو بەیانی‌یك . دۆستەکەم ئەهاتو قامەتی وەکو عەرعەری خوی . پیٚ دەنواندم .

ئیسه لێڵاوی ، ئەو نەدینمەن
جەو پەی ئاهیٚ سەرد ، زاریو شینمەن (٧)
ئیسه پەی دووری ، قیبلەم مەناڵوو
گەردیٚ پاو پاڵاش ، وە مژە ماڵوو (٨)
یە خەیلیٚ وەختەن ، لێم نادیارەن
نەشەو خاوم هەن ، نە ڕۆم قەرارەن (٩)
کەسیٚ کە دۆش ، نەپیۆارش بۆ
چەنی بەشەو خاو ، ڕۆ قەرارش بۆ (١٠)
چون «بیٚسارانی» هەرکەس بیٚدڵ بۆ
چون باغچەی بیٚ ئاو ، دایم بیٚ گۆڵ بۆ (١١)

---

(٧) ئیسە : ئیستا ، لێڵاوی : کوێراوی ، نەدین : نەبینین ، جەوپەی : لەبەر ئەوە ، زاری : پاڕانەوە وگرین . واتە : بەڵام ئێستا کوێراوم داهاتوەو دۆستەکەم نابینم ، لەبەر ئەوەیە هەناسەی سەرد هەڵئەکێشمو دەپاڕێمەوە ودەگریم .

(٨) پەی : بو ، مەناڵوو : دەناڵێنم ، پا : قاچ ، پاڵا : پێڵاو ، کەوش ، مژە : برژانگ ، ماڵوو : ئەماڵم ، گزگ ئەدەم . واتە : ئێستا لەبو دوورکەوتنەوەی دۆستەکەم دەناڵێنم وە بەردەوام لەسەر ئەوەی ، تۆزی پێڵاوەکانی بەبژانگ ، پاکو خاوێن بکەمەوە .

(٩) یە : ئەمە ، خەیلیٚ : زۆر ، وەخت : دەم ، کات ، نادیار : نادیار ، هەن : هەس ، ڕۆ : ڕۆژ ، واتە : ئەمە زۆر دەمێکە دۆستەکەم لێم نادیارە ، جا لەبەر ئەوە ، نە بەشەو خەو لە چاوانم دەچێتو نە بە ڕۆژیش قەرارم ماوە .

(١٠) پێوار : نادیار ، شاراوە ، واتە : ئەو کەسەی کە دۆستی لیٚ بشارێتەوە ، چۆن ئەتوانیٚ بە شەو خەوی لیٚ کەوێتو بە ڕۆژ قەراری ببێت .

(١١) بیٚدڵ : بیٚ دۆس ، دڵ ، لە ووتەی هەورامی‌دا ، جگە لەو مانا بەناوبانگە ، واتە : قەلب ، فؤاد ، بە مانای «دۆس» «یار» یش هەیە ، واتە : هەرکەسیٚ وەکو «بێسارانی» دۆستی نەبێت ، وەکو باخچەیێکی بیٚئاو ، کە گۆلی نەبێت ، وایە .

تیٚبینی

(٤) ووشەی «خەڵکان» ، لە هێندیٚ نۆسخەدا «مۆرغان» هاتوە ، کە بە مانای «مەلو مۆر»ە ،

(٦) لە هێندی نۆسخەدا : «مەنماناش باڵا نەمامیٚ نەوبەر» نووسرا بوو .

(١٠) «چەنی نەناڵۆ ، چۆن قەرارش بۆ» یش لە تەنیا نۆسخەیێکدا ، بینرا .

(١١) «باغچەی بیٚ ئاو» ، لە نۆسخەیێکدا «باغیٚ وێران» هاتوە . وە لە هێندی نوسخەدا ، دێری دوایی بە تەواوی ، نەهاتبوو .

ئیمشەو ئـــــایـــــریٚ گرِبـــــەست نــــــه دەروون
بـــــلّیسەش یـــاوا بـــــه سەقـــــفیٚ گەردوون[(١)]

جـــــەگرِەی ئـــایـــــر ، جــــه بـــلّیسەی نـــار
ستـــــیٚزام چون بـــــەرق ، ئـــاو کـــــەردم هـــــاوار[(٢)]

جـــــه هـــــاوار هـــــاوار ، شفـــــاو لالّەی من
جــــه هــــەی ئــــاو ، هــــەی ئـــاو ، شینو زالّەی من[(٣)]

تەمز مـــــــەژنـــــــەوٚو یــــــەك خوٚدا تـــــــەرسیٚ
سلّیان سیٚفـــــــــــەت ، رِای خوٚدا پـــــــــــــەرسیٚ[(٤)]

مــــــــەشوٚ مــــــــاوەروٚ کوٚزەی بــــــــیت المال
مـــــــەشانوٚش وه رِووی گرِ بـــــــەستـــــــەی تـــــاوەن[(٥)]

---

ماموٚستا «بیٚسارانی» لەم پارچه هوٚنراوەدا ، له بەختی نا لەبارو ئیقبالّی چەوتی خوٚی . گلەیی ئەکاو ئەلّیٚ :

ئەگەر ئیٚوەیش بەخت له گەلّتانا یار نەبوو ، هەولّو تەقەللای بیٚسوود مەدەن .

(١) ئایر : ئاگ . نه : له . یاوا : گەییشت ، سەقف : ئاسمان (= عاسمانگ) . واته : ئەمشەو ئاگریٚ لەناو دەروونمدا هەلّ گرا : که ئەوەند بەتیژگ بوو . بلّیسەی تا عاسمانگ گەییشت .

(٢) نار : ئاگر . ستیٚزام : هەلّچلەکام . بەرق : چەخماخەی هەوری بەهار . کەردم : کردم . واته : لەبەر بەرز بوونەوەی گرِو بلّیسەی ئەو ئاگرە . وەکوو چەخماخەی هەوری بەهار . هەلّ چلەکامو هاواری ئاوم کرد .

(٣) شفا : پارِانەوه . لالّه : لالاّن . زالّه : پارِانەوه به دەنگی گرینەوه . واته : له پارِانەوەو لالاّنەوەو گرینوو شینی من . (مانای ئەم شیٚعرەو شیٚعرەکانی دوائیی بەسراوه بەیەکەوه) .

(٤) تەمز : توٚ مەلّیٚ . مەژنەو : ئەبیٚسیت . رِای خوٚدا : رِیٚگای خودا . واته : توٚ مەلّیٚ پیاویٚکی له خوٚدا ، ترسو موٚسوٚلّیان سیٚفەت ئەو دەنگەی من ، که هاوار دەکەم ، دەبیٚسیت .

(٥) مەشوٚ : ئەچیٚ . ماوەروٚ : دینیٚت ، کوٚزه : گوٚزەلّه . بیت المال : لەمیٚژەوه که بانكو جیٚگای دوور له مەترسی ، له بوٚدانانی پولّو پارەو ئەشیای بانی دارنەبوو . خەلّك شتەکانیان کوٚئەکردەوەو ئەیاندا ، بەدەستی پیاویٚکی ئەمینەوه که لەبوٚ ئەوان چاودیٚری لیٚوەبکات . مەسیحیەکان ئەو شتانەیان له سەدەکانی ناوەرِاستدا ، ئەسپارد به دەستی قەشەکان که پاریٚزەری کلیٚسا بوون ، وه له سەدری ئیسلامیش ئەو جیٚگایه ، پیٚی ئەگوٚترا : «بیت المال» . مەشانوٚش : ئەی رِیٚژیٚت . وەرِووی : بەملی ، گرِبەستەی شەمالّ : ئاگریٚ که بای شەمالّ لیٚی داو باش باش پەرەی پیٚبدات . واته : ئەچیٚ گوٚزەلّەییك له «بیت المال» دینیٚتو ئەی رِیٚژیٚت به ملی ئەو ئاگرەیدا که شەمالّ پەرەی پیٚداوه .

پێسە مەزانۆ یە کوزەی ئاوەن
نمەز خۆ یە نەفت . کۆی تەوەن تاوەن [٦]
کۆزەی نەفتش کەرد . وە بڵێسەمدا
قرچەی کوزەی نەفت . وە ستێزەمدا [٧]
هەر تا سەحەر بی . هەر سۆزام بە سۆز
سەحەر سفتەکۆم . با بەردش ، چون تۆز [٨]
هەر کەس وێنەی من ئێقبالش چەفتەن
نەواچۆ هەی ئاو . نەسیبش نەفتەن [٩]

---

(٦) پێسە : وەها . نمەز : نازانێ . نەفت : نەوت . کۆ : کێو . تەوەن : بەرد . تاونای : تواندنەوە
واتە : وەها ئەزانێ ئەم گۆزەڵە ئاوی تیایە . نازانێ نەووتی تیایە . ئەو نەوتەی کە بەرد ئەتوێنێتەوە .

(٧) قرچە : دەنگی سووتانی هەر سووتەمەنییەك . لە کاتێکدا کە ئاگرەکە زۆر بەتین بێت . واتە :
گۆزەڵەی نەوتەکەی کرد بە بڵێسەی ئاگرەکەمداو ئێجگار قرچەم لێ هەستاو ئیتر هەر ئەبرژیم و دا ئەکەوتم .

(٨) هەرتا : تاوەکو . سۆزام : سووتام . بەسۆز : بەسووتێنێکی بێ‌وچان . سفتەکۆ : خۆڵەمێش .
بەردش : بردی . واتە : تا بەرەبەیان من بەبێ وچان ئەسووتام تا بووم بە خۆڵەمێش . ئینجا کە ڕۆژ بووەوە . با خۆڵەمێشەکەمی وەکوو تۆز بردو پەخش‌و بڵاوی کردەوە .

(٩) وێنە : وەکوو . چەفت : چەوت . مەواچۆ : نەڵێت . نەئێژێت . نەسیب : بەش . بەخت . واتە :
هەر کەسێ وەکو من . ئێقبالی چەوتە . هاواری ئاو نەکات . چونکە . بەشی نەوت ئەبێت .

١ ئیم شەو جەستەی من ،

ئیم شەو ئەرمەدیش کەسیّ جەستەی من[1]

٢ - جالیّ پەشیۆیای ، جەستەی خەستەی من

نائومیّد مەبی پەریّ جەستەی من[2]

٣ - دەروون جە دووری مەگریا بەتاو

جە چەم مەتکیا پەیا پەی هوو ناو[3]

٤ - نالەی نالینم وە پای عەرش یاوا

رۆخسارم نەروی زەمین مەساوا[4]

٥ - نەگاهیّ راحەت نە لادیّ ئارام

تاسۆب سپی بی بەی تەورو یارام[5]

٦ - کەسیّ پەی قیبلەش یە ژیانش بۆ

پەیش کەمەن بەی تەور ئەرسەد گیانش بۆ[6]

---

مامۆستا «بێسارانی» ئەم پارچە هەڵبەستەی لە کاتێکدا گۆتوە کە لە دوورکەوتنەوەی خۆشەویستەکەی ـ دەروونی ـ پڕ لەئاگرەو لە چاوانیشی ـ جیاتی فرمێسك ـ خوێن دێتە خوارەوەو ناڵەی دەروونی بە عەرش ئەگات .

(١) جەستە : لەش . مەدیش : ئەیبینی . چاوی پیّ ئەکەوت . واتە : ئەمشەو ئەگەر کەسیّ ئەهاتوو لەشی منی چاو پیّ‌ئەکەوت .

(٢) حالّ . حالّ . پەشێویا : شێواو . خەستە : ماندوو . نەخۆش . شەکەت . نائۆمێد : نائۆمێد . مەبی : ئەبو . پەریّ : لەبۆ . واتە : وە حاڵی بە شێواوی لەشی منی ئەبینی کە زۆر ماندوو لاواز بەرچاو ئەکەوت . بەتەواوی لەبۆ لەشی من . نائۆمێد ئەبوو .

(٣) تاو : تین . چەم : چاو . مەتکیا : ئەهاتە خوارەوە . پەیاپەی : یەك لە دوای یەك . واتە : دروون لە دووری یار ئاگری تیّ‌چوو بوو وە لە چاوان . یەك لە دوای یەك فرمێسکی خوێناوی دەهاتە خواریّ .

(٤) یاوا : گەیشت . رۆخسار : روومەت . زەمین : عەرز (= ارض) . مە ساوا : ئەم مالّی ی واتە : نالەوهاوارم بە عەرش ئەگەیشت ورِوومەتم لە بەر ئازاری دەروون . بەعەرزائەماڵی ی .

(٥) گاهیّ : دەمیّ . راحەت : رەحەتی . وچان . لادیّ : (تاویّ) دەمیّ . ئارام : ئارام . بەیتەور : بەم جۆرە . ویارام : رامبوارد . واتە : نە دەمێك رەحەتیم گرتو نە تاوێك ئارامم بوو . بەم وینەیە تا قەراخی عاسمانگ سپی بو . ئەو شەوەم رابوارد .

(٦) قیبلە : خۆشەویست . پەیش کەمەن : لەبو ئەو کەمە . واتە : کەسیّ کە بۆ خۆشەویستی خۆی ژیانی وەهابێت . بەراستی ئەگەر سەد گیانیشی هەبێت . هێشتا هەر کەمیەتی .

١ - ئێم شەو خارێ یاو ، زەمانەی وساڵ
بەردش بە دڵدا ، جە دەستێ خەیاڵ[١]
٢ - وەختێ خار نە تەخت دڵ گرتش قەرار
شکەفتنانە ڕووم گوڵ هەزار هەزار[٢]
٣ - جە چەی زامێ خار دەست نیشانێ دڵ
خەم بی وە گوڵزار من بیم وەبڵبڵ[٣]
٤ نالەی بڵ بڵیم (بڵەند) پایە بی
جە پەی شوم بەختیم ئایر مایە بی[٤]
٥ جەستەم هەر گریا تا سۆب بەیاندا
سۆب بالام نیشان سفتە دلاندا[٥]

---

هێندێ جار . نووسەر یا شاعیرە تیژبیرەکان ، باڵەندەی تیژباڵی ی خەیاڵیان . باڵ ئەگرێتەوەو لە ڕوانگەی دڵی ی ئەوان ئەنیشێتەوە . جا لەو کاتەدا . نووسەر یا شاعیر . ئەو خەیاڵە ئیجگار ناسك و زەریفە ئەکا بە پەخشان یا هۆنراوە (=شێعر) . وە ئەم پارچە هەڵبەستەی . مامۆستا بێسارانی لەو چەشنەیە .

(١) خار : دڕگ . زەمانەی وساڵ : کاتی بەیەك گەیشتن . بەردش : بردی . بەدڵدا : بەناو دڵدا . یاو : تا . واتە : ئەمشەو دڵ بە دەستی ی خەیاڵەوە . لەکاتێکدا خەریك بوو بە خۆشەویستەکەی . بگات . «تا»ی لێ تایبن بووە ئەو «تا» یە وەکو دڕگێك بوو . چەقی ی . بەناو دڵدا .

(٢) وەختێ : کاتێ . نە : لە . تەخت : ناوەڕاست . گرتش : گرتی ی . گرتش قەرار = جی گیر بوو . شکەفتن : پشکەوتن . ڕووم : ڕوومەتم . واتە : کاتێ ئەو دڕگە لە ناوەڕاستی ی دڵدا جی گیر بوو . هەزار هەزار گوڵ لەسەر ڕوومەتم پشکەوتن . (مەبەست ئەوەیە کە کاتی ئینسان . «تا» ئەی گرێ . لەشی ی گشت داغ ئەبێت و بە تایبەت ڕوومەتی ی وەکوو گوڵ سوور ئەبێتەوە کە لەو کاتەدا . ئەڵێن . ڕوومەتی ی . گوڵی ی داوە .

(٣) جەپەی : لەبەر . بەبۆنەی . زام : برین . خەم : غەم ، بیم : بووم . واتە : بەبۆنەی برینی ی ئەو دڕگەوە . کەوادڵی ی دەست نیشانی خوی کرد بوو . غەم لەلام بوو بەگوڵزارو منیش بووم بە بۆلبۆلی ی گوڵزارەکە .

(٤) ناڵە : ناڵان لەبەر برین و ئازار . بڵەند : بەرز ، شووم بەختی ی : چارە ڕەشی ی . واتە : ئەو کاتە وەکوو بۆلبۆل ناڵەم بەرز بوو وەو لەچارە ڕەشی ی خوم جگە لە مایەیکی . ئاگر . شتێ ترم نەبینی ی .

(٥) گریا : ئەگرا . نیشان : پیشان . سفتە دلان : دڵ سووتاوان . واتە : تا ڕووناکی ی ڕۆژ . لاشەم هەر ئەگرا . جا ئەو کاتە پیشانی ی دڵسووتاوانم دا تا بی ی بینن .

١ - ئیم شەو جە خاودا زوڵفیٚ دیٚزیٚ دیم
چون سیاماران سەراویٚزیٚ دیم
٢ - شیانیٚ گرتم من جە نەزانی
ئەمز ئەو قاتڵ(. . . . .)(٢)
٣ - تیٚژتەر جە ئەڵماس قولایش سازا
یەك زەرەی تەنم ناستش بە ئازا(٣)
٤ - ڕۆح جە تاویای زامیٚ گیروگاز
پەریٚ ئاسایش ئاماوە پەرواز(٤)
٥ - واتش مەر بشون دوورگنون لیٚشان
زامیٚ گازیٚ مار مەتاوو کیٚشان(٥)

---

هونەر بە ڕوواڵەت شەویٚك لە خەویا . زولفی کیژیٚکی جوان . کە وەکوو ڕەش ماریٚك کە سەر بەرەو خوار وەستابیٚت ، ئەبینیٚت وە ئەچیٚت بیانگریٚتە دەست . ئیٚتر ئاگای لەوە نابیٚت کە ئەم زوڵفە تیژتر لە ئەڵماسە ، وەکوو ڕەش ماری بیٚ ئیجازە وایە . تا کاتیٚ ئەزانیٚ تەواوی لەشی‌ی زامدار بووە وە ڕۆحی‌شی‌ی لەو هەموو تەعزیبە ، ئەیەویٚ خوی‌ی خەلاس کا وە لە بەدەن دەربچیٚت . بەلاٚم ڕەش مار ڕیٚگای لیٚ ئەگریٚت‌و لە دەرچوونی‌ی بەرگری‌ی ئەکات .

(١) دیٚز : ڕەشی‌ی کالٚ ، سەر ئاویٚز : سەر بەرەو خوار ، واتە : ئەمشەو لەخەودا . زوڵفیٚکی‌ی ، وەکوو ڕەش ماریٚکی‌ی سەر بەرەو خوارم بینی‌ی .

(٢) شیانیٚ : چووم . واتە : چووم‌و لە نەزانی‌ی‌و نا بەئەدەبی خوم ئەو بە ڕوواڵەت زولفەم گرت . .

(٣) تیٚژ : تیژ ، سازا : پیٚکی‌ی هیٚنا ، تەن : لەش ، ناستش : نەی هیٚشت ، نەی هیٚلاٚ ، ئازا : ساغ ، بیٚ ئازار ، بیٚ برین . واتە : تیژتر لە ئەڵماس قولاٚیکی‌ی پیٚك‌هیناو تەواوی ، لەشمی‌ی ، پی‌یٚ برین‌د ر کرد .

(٤) تاویای : توانەوە ، ئاسایش : وچان دان ، ئاما : هات ، پەرواز : باڵ‌گرتنەوە .
واتە : ڕۆحی‌ش لەبەر ئەو هەموو ئازهردانە ، لەبۆ وچان‌دانیٚك هەولی دا باڵ بگریٚتەوە .

(٥) واتش : گۆتی‌ی ، لشون : بچم ، دوورگنون : دوور بکەومەوە ، لیٚشان : لە ئەوان . مەتاووکیٚشان : ناتوانم تەحەممول بکەم . واتە : گۆتی‌ی (ڕۆح) ، ئەبیٚ بۆی دەربچم‌و لی‌یان دوور بکەومەوە ، چوونکە ناتوانم تەحەممولی‌ی زامی‌ی گازی‌ی مار ، بکەم .

٦ ئەودی هەم بەردش سەر نەدەهانم
ڕاگیرلی پەرێ ڕۆحی ڕەوانم [٦]

٧ - ئەو جە ئێشێ زام هایڵەی قاتڵ
وێش جە پەروازی ئەو کەردەن باتڵ [٧]

٨ - بەی گشت زامە وەشی وەتەنما
بەتەنێ پڕدەرد خەم وەتەنما [٨]

(٦) ئەودی : ئەو کاتە ، دەهان : دەم ، ڕاگیر : ڕێگەکەی کردە بەند . ڕەوان : ڕۆح ، واتە : ئەو کاتە سەری‌ی بردە ناو دەم وە لە دەرهاتنی‌ی ڕۆحم لە بدەنمدا ، برگرلی ، کرد .

(٧) ئێش : ئازار ، هایڵە : پڕمەترسی‌ی ، وێش ، واتە : ڕۆح کە وای بینی‌ی . بەو هەموو زامی‌ی پڕ لە مەترسیەوە ، لە چوونە دەرێ ، پەشیمان بوەوە .

(٨) وەتەن : نیشتمان ، نیشتگە ، واتە : بەو هەموو زامەوە گەڕایەوە و چوەوە بە لەشما ، بەو لەشەی پڕ لە برینو ئازارەی کە وەکوو نیشتمانی خەم وایە .

١ - ئارۆدیم بە چەم نازك ئەندامیٚ
ساوای تەن تەراو تولٚە نەمامیٚ [١]

٢ - عەرعەر بالاٚیٚ شای جەمین جامیٚ
زولٚفان چون كەمەند خیاتەی خامیٚ [٢]

٣ - گرتە بێش وە دەس تولٚیٚ جە عەرعەر
ساوای نازك تەن سافیٚ ناز پەروەر [٣]

٤ - گاه بە دیدەی ناز مەدیا پێش دا
گاه مەگرت وە بەژن وە بالاٚی وێش دا [٤]

٥ - هەر وەخت پەیش مەدیا وە نازیٚ چەمان
چەفت مەبی جە تاو مژەش چون كەمان [٥]

---

(١) ئارۆ : ئەمرۆ . چەم : چاو . نازك : ناسك . ئەندام : ئەندام . ساوا : ساوا تەن تەراو : گەنج و پێ‌كەوتوو . تولٚە نەمامیٚ : نەمامێكی تازە هەلاٚتوو . واتە : ئەمرۆ كیژێكیٚ زۆر ناسك و بەژن و بالاٚ خوشم چاو پێ‌كەووت كە وەكوو نەمامێكی‌ی ساوای تازە هەلاٚتوو وابوو .

(٢) بالاٚ : بەژن . عەرعەر . دارێكی ساف و بەژن جوانە . جەمین : ناوچاوان . جام : ئاوێنە . خیاتەی خام : خیاتەی خاو . واتە : بەژنی‌ی وەكوو داری‌ی . عەرعەرو ناوچاوانی‌ی ئاوینەیەو زوٚلفیشی‌ی وەكوو كەمەند درێژەو لە نەرمەو نیانی‌دا وەكوو خیاتەی خاو وەها ئەهاتە بەرچاوان .

(٣) گرتە بێش : گرتبووی . واتە : تولٚیٚ ناسك و ساف و زۆر ڕێك و پێكی‌ی لە داری‌ی عەرعەر گرتبوو بە دەستیەوە .

(٤) گاه : برێ جار . دیدە : چاوان . مەدیا : ئەی نواڕی‌ی . پێش دا : بە ئەودا . مەگرت : ئەی گرت . وێش دا : خوی‌دا . واتە : برێ‌جار بەنازی چاوانەوە - ئەی نواڕی‌ی بەوداو برێ جاریش ئەی‌گرت بەبەژن و بالاٚی خوی‌یا .

(٥) یەروەخت : هەركاتیٚ . چەمان : چاوان . تاو : گەرما . واتە : هەركاتیٚ - بەنازی‌ی چاوان ئەی‌نواڕی‌ی پێ‌یا ، لەبەر گەرمای برژانگی‌ی وەكوو كەمان ئەچەمایەوە .

٦ ئــــــــەوسا مـــــــەگرتش ڕاس چـــــــەنی بـــــــالاْ
مـــــەلـــــەرزاو مـــــەکـــــەفت نـــــەپـــــاش مـــــەلالاْ[٦]

٧ «یـــــانیْ جـــــەهـــــەرکۆ نـــــەمـــــامیْ بـــــاخ بۆ
یـــــائـــــەو وه بـــــالاْی ویْش بـــــه دەمـــــاخ بۆ»[٧]

٨ «هـــــــەنی وه بـــــالاْی ویْشان نـــــــەنـــــازان
ئـــــــاوات وه سایـــــــەی بـــــــالاْش بوازان»[٨]

(٦) ئەوسا : ئەوکاتە . چەنی ی : لەگەلْ .مەلەرزا : ئەلەرزی ی . مەکەفت : ئەکەووت .
مەکەفت نەپاش : ئەکەوتە ژێر پی ی . مەلالاْ : ئەلالاْیەوە . واتە : ئەو کاتە ئەیگرت بە بەژنی ی خویا . تووڵیش کە لە خوی ی زۆر شەرمەزار . بوو و چەمابووەوە . ئەلەرزی ی و – خوی ی ئەخستە ژێر پی ی و ئەلالاْیەوەو ئیعتیرافی ی بەم واقیعیەتە ئەکرد. (٧)و(٨)
. لە هەر کویْ نەمامیْ لە باخان هەیە کە بەژن و بالاْیکی ی زور ڕێك و پێکی ی هەیەو خوی ی بەسەرباشقە دەزانیْ . پی ی بلێن با ئیتر شانازی ی بە بەژنی ی خوی ی نەکا . و ئاوات بەسیبەری ی بالاْی ی ئەو (= خوشەویستەکە) بخوازیت . جەهەرکۆ : لە هەر کویْ بەدەماخ بۆ : شانازی ی – پێوە بکا . هەنی ی : ئیتر . نەنازان : شانازی ی پێوە نەکا . بووازان : بخوازن .

١ - ئــــــاخ پــــــەی مـــــــنــــــاڵی . . . . .
ئـــــاخ وا درێغــــا پـــــەرێ مــــــنـــــاڵی [١]

٢ - گۆشەی خـــــاتـــــرم جــــەخــــەم بێ خـــــاڵی
لاقـــــیـــــد بیم جـــەتـــــان جــــەوەشیو تـــاڵی [٢]

٣ هـــــەر بــــازیم مــــەکـــــەرد من چـــــەنی یـــــاران
مــــــەشیم وە بـــــــاوەش نـــــازك نــــــازاران [٣]

٤ نــــــــازاران جـــــــــەمین لـــــــــێم نمە پۆشان
مـــــەکـــــــەردم سەیـــــــران زوڵفێ وەش بۆشان [٤]

٥ ئـــێسە جـــــە شوومی زەمـــــانـــــەی بـــــاتـــــڵ
نـــــازاران یـــــەك یـــــەك لـــــێم مـــــەکـــــەران سڵ [٥]

---

شاعێر لەم پارچە هەلبەستەدا . وەکو زۆربەی خەڵك . ئاوات لە خولی منداڵیی دەخوازێت . واتە :-ئەم کاتە کە هیچی لەسەر نەبوەو کەسێ شەرمی لێ نەکردوە . هەر خەریکیی .یاری منالأنە بوەو بە - باوەشی ئەمو ئەوەوە بۆ خوی سەیرانی کردوە . بەڵام لەکاتی گۆتنی ئەمشیعرانەدا خوی بەبێگانە لای خەڵك دەزانیو گلەئی لە زەمانە دەکات :

(١) درێغا :ئەفسوس . واتە : ئاخم بۆ دەورەی منداڵی . داخم بۆ دەورەی منداڵی .

(٢) خاتر (=خاطر) : ضمیر . دڵ . فکر . تان (=طن) : لۆمە . وەشی : خۆشی . واتە : دڵم لە هەموو - رەنگی غەمو پەژارەیەك خاڵی بوو مۆقەیدی هیچ چەشنە لۆمەو خۆشیو ناخۆشی نەبووم .

(٣) بازی : یاری . مەکەرد : ئەمکرد . چەنی : لەگەڵ . یاران : هاوەڵان . مەشیم : ئەچوم .واتە : لەگەڵ هاوەڵەکانما هەر خەریکی یاری بومو ئەچومە باوەشی ناسکە نازارەکان .

(٤) جەمین (=جبین) : روومەت . نمەپۆشان : نەیان دەپۆشی . وەش بۆ : خۆش بێن (=بۆن) .ئەو کاتە ئەوان لەمن شەرمیان نەدەکردو روویان لێ هەڵ نەدەگێرام وەمنیش سەیرانی - زوڵفی خۆش بێنیانم .ئەکرد .

(٥) شووم : نامۆبارەکی . سڵ : لەبڕ وەستانو نەچوونە بەرەوە . کوتوپڕ وەستان .
واتە : ئێستە بەڵام . بەداخەوە . زەمانە لێم وەرگەڕاوەتەوەو ئەو ناسكو نازدارانە . کە چاویان پێم دەکەوێ لێم دەترسنو پاگێزە ئەیانگرێتو ناتوانن بێنە بەرەوە .

١ - ئـــافـــتـــاو پـــێواری . . . . .
وەخـــتێ جـــە مـــەغـــرێب ئـــافـــتـــاو پـــێ واری [١]

٢ - جـــەمـــیـــنش نـــەبـــرج تـــەشاو دیـــاری
پـــەیوەست گەرمی وەخت سۆبو ئـــێوار بی [٢]

٣ - بـــەنورێ جـــەمین شەوق ئـــارای تـــەمـــام
یـــاو نـــا وەهـــەم وەخـــتێ سبحو شام [٣]

٤ - سپـــەردم بـــەنوور بـــارگەی ئیمـــان
(چـــنـــدێ . نوور بـــەخش بۆ پـــەی سۆبو شامـــان [٤]

٥ پـــرشنگێ نوورش پـــەی پـــەی مـــەشانـــا
مـن دەرسات نـــەرووش (لافـــتـــام) وانـــا [٥]

---

(١)و(٢) ئافتاو : هەتاو . خۆر . پێوار : نادیار . پەناکەوتوو . مەغرێب : خۆرئاوا . مەعنای - ئەم شێعرەو شێعری‌ی دووانی بەسراوە بەیەکەوە : هۆنەر لەکاتێکا ئەبینێ خورئاوا ئەبێت . هەر لە عەینی‌ی کاتا شاهێدی هەڵاتنی‌ی هەتاوێکی تر لە خورهەڵاتەوەیە . شاعێر ئەڵێت : لەکاتێکا - هەتاو لە خورئاوا پەناکەووت . ناوچاوانی‌ی هەتاوێکی کە . لە خورهەڵاتەوەیە . لە «برجی‌ی تەشاو» هاتە دەرێ . لێرەدا - بەیانی‌یو ئێوارە بەیەك گەیشتن . ئەم تەعبیرە ئێجگار ناسكو دڵرفێنە .
جەمین : ناو چاوان . تەوێڵ . برج تەشاو : بە ڕواڵەت ئەبێ ناوی جێگایێ بێ یاخود ئیستیلاحێکی‌ی زانستی‌ی هەستێرە شناسی‌ی بێت . پەیوەست : بەیەك گەیشتوو . سۆب : بەیانی‌ی (صبح) .

(٣) نوور : نوور . ڕووناکی‌ی . بارگە : بارگە . چەنی‌ی : چۆن .یاونا : گەیاندی . سبح =صبح .
شام : ئێوارە . واتە : بەڕووناکی‌ی ناوچاوانی کە شەووق ئەو هەموو عالەمی‌ی گرتبوەبەر . هەتاووی بەیانی‌ی وئێوارەی بەیەك گەیاند .

(٤) سپەردم سپاردم . واتە : دامە دەستی‌ی ئەو ئیمانە تالە تیری‌ی چاووی بەد بی‌ی پارێزن- تا بۆ ماوەیە بینە هۆی ڕووناکی‌ی . ئێوارەو بەیانیان .

(٥) پەی‌پەی یەك لەدووای یەك . مەشانا : ئەی‌وەشاند . دەرسات : بەزووترین کات .ڕووش : لەسەری لافتی :سوورەتێکی قورئانە کە بۆ بەرگری‌ی لە زەخمی‌ی چاوی‌پیس - ئەی خوێنن بە ملی‌ی خوشەویستا یاخود دەی‌نووسن‌و پی‌یەوە دەبەستن . جا ئەڵێ کە - من ئەم کارەساتەم چاو پی‌کەووت . بەزووترین کات دەستم کرد بەخوێندنی‌ی سورەتی‌ی - «لافتی» .

١ - ئەجەل داوم بۆ . . . .
تاکەی من چەنی دەوران داوم بۆ[١]
٢ - تاکەی شەو بێ یار شیرین خاوم بۆ
بۆ باپات وە بان هەر دوو چاوم بۆ[٢]
٣ - ئەر سەد پەژاران گیانم مەستانان
وەس نیەن بە نام زیندەم مەوانان[٣]
٤ - سپای غەم بەی تەو زۆر گرتەن وەنەم
هەر ساتێ مەرگێ مەن مانۆ پەنەم[٤]
٥ مەندەن نیمەیێ ئەویچ هێجرانان
گەرەکشان بە زۆر چەنەم بستانان[٥]

---

شاعیری مەزن لەم پارچە هەڵبەستەدا . داوا لە ئەجەل . واتە (قابض) . ئەکاکە بە - زووترین کات بێت بۆ گیانکێشانیی ئەو و لەو هەموو سۆپای غەمو پەژارەیە کە دەوروبەریی ئەویان داوە . نەجاتیی بدات . بەڵام خوشەویستەکەی قەت . ئەوی بیرناکەوێتەوەو هەواڵیشیی لێ ناپرسێ .

(١) ئەی ئەجەڵ من تاکەی ئەبێ لەگەڵ دەوراندا . ناکۆکیم بێت . (٣) تاکەی من بەبێ - دۆست خەوی شیرینم بێت . دەبا بەس بێ . وەرەگیانم بکێشە . بەخێر بێی . پێلاوت - بەسەرچاوانم .(٣)- ئەگەرچی غەمو پەژارە گیانیی سەندووم . بەڵام ئەوە هەیە کە - بەناو زیندوم . (٤) - سۆپای غەم وا دەوروبەری لێگرتووم . کە هەموو سەعاتێکم بۆ مەرگێکە .

(٥) لاموایە نیوە گیانێکم پیماوە کە دووریو جیایی . ئەیان ئەوێ ئەوەیشم بەزۆر لێبستێنن

٦ نـــــەواچـی پـــــەی چـــــێش من چیم نـــــەزانــــــان
نـیـســـە هــــامــــا چـون ، ئـــەجـــەڵ هـــای هــــانــــان ؟(٦)
٧ گیــــــانیٚ کــــــە بـــــەرشیی بـــــەیـــــەك دیـــــانیٚ
جــــــە کۆ بــــــاوەروون پــــــەرێت ، گیــــــانیٚ ؟(٧)
٨ شەمـــــاڵ شۆ واچــــــە ، بــــــەو ئــــــایــــــرنــــاکـــــە
بــــەو دڵ سفـــتــــەی خــــەم سیـــنـــە چـــاکچـــاکـــە(٨)
٩ ئــــــەر سەد ساڵ سۆ چۆوەنـــــــدار جــــــە شاخــــــان
چ پـــــەروا دارۆ عــــــەرعــــــەر جـــــە بـــــاخـــــان ؟(٩)

---

(٦) ئەی ئەجەل ئەوەتا ئێستا پێت ئەڵێم . ئەوەکوو لەوەودوا پێم بڵێیت . بۆچ من نەمزانیوە ؟ (٧) - ئەگەر ئەو گیانەم . بە تەنیا چاو پێی کەوتێ . لەدەس دەرنچێ . (٨)- شەماڵ . تکایە برۆ بەو ئاگر تێبەربووە . بەو دڵ سووتاوەی . سینە شەقکراوە . بڵێ : ئیتر ناتوانم گیانێکی کە لە بۆ تۆ پەیا بکەم و قەرزی تۆ بدەمەوە . (٩) ئەگەر داری قەزوان - سەد ساڵ بەو شاخانەوە بسووتێ . عەرعەر لە ناوی باخان . چ غەمیەتی ی ؟

ئەجەل : قابض . داو : کورتکراوەی داوا بەمەعنای «شەر» . ناکۆکیی . مەستانان : ئەسێنن . وەس : بەس . زیندە : زیندوو . مەوانان : ئەخوێنن . سپا : سوپا .
زۆرگرتەن وەنەم : زۆریی لێهێناوم . مەئمانۆ پەنەم : پێم پیشان ئەدات .
مەندەن : ماوە . هێجرانان : دووریو جیایی . گەرەکشانە : ئەیانەوێت . چەنەم : لێم ستانان بسێنن . نەواچیی : نەڵێیت . ماچوون : ئەڵێم . بەرشیی : دەرچوو .
دیان : نواربن (روانین) . جەکۆ : لەکوێ . وەندار : داریقەزوان . پەروا : ترس . غەم .

١ - ئـــــاروخــــــمـــــانم چون دەمـــــاوەنـــــدبێ
دیــدەی قــیـبــلــەم دیم ، بــەنــدیْ شەو بــەنــدینم بێ[١]
٢ - واتم هـــــەی قـــیـــبــــلـــــەم (ئیمان) و دینم
من بـــەو دیــــدەی تۆ دنـــیـــا مـــەویـــنم[٢]
٣ - مـــــەگەر نـــــەی شەلاْ ئـــیشیْ هـــاتـــێشدا
پۆکـــــەی شەو بـــــەنـــدت ، ئـــاوردەن پـــێشدا ؟[٣]
٤ - وات بێ‌ئـــــارامـــــەن ، وەشەڕ شەڕیـــــکـــــەن
هونـــیـــنیْ دەردین ڕاویـــار پـیکـــەن[٤]
٥ - ئــــەر مــــەرەخــــەس بۆ چون هـــــەردەجــــاران
دەیـــیـــار نمازۆ جـــــە ڕاویــــاران[٥]

---

لوتکەی دەماوەند بە بەرزائی ٥٦٧١ مەتر . کەوتوەتە شیمالی خۆرئاوای «تاران»وە . لەسەر زەنجیرە شاخەکانی ئەلبۆرزە . لە تەواوی درێژایی سالْ بەفری پێوەیەو بە تایبەت هەموو کاتیْ «تەم و دوکلاْویە»وە تەمەبوەتە هۆی ئەوە کە گەلیْ لە نوسەرو . شاعیرەکان . پەخشان . یا هۆنراوەیان لەو بابەتەوە . نوسیوە .کە بو نموونە ئەتوانین « صادق هدایت» ناوبەرین کە چیرۆکێکی بەناوی «میمونهای دماوند» . واتە «مەیموونەکانی دەماوەند» نوسیوە . هەروا مامۆستا مولەوی (= معدومی)یش لە شیعرێکا ئەلیْ :

منو دەمـــــاوەنــــــد مـــــەرجان کــــــەردەن
ئـــــاد «تـــــەم» و من خـــــەم . تـــــاوە ڕۆی مـــــەردەن»

جا دوکەلّەکەی دەماوەند . هۆی ئەوەیە کە ئەو کێوە «بورکانی» واتە (آرتەش فشان»ە . وە تەمەکەیشی بەهۆی بەرزی ئەو لوتکەی پێك‌دێت .

ئەوەتا مامۆستا «بێسارانی»ش لەم شێعرەدا . دەروونی خۆی وەکو لوتکەی کێوی دەماوەند «تەماوی» لەخەم . ئەبینیْو ئەلیْ :

(١) ئەمرۆ دلّم «غەم»دای‌گرتبو وەکو چۆن دەماوەند «تەم» دای ئەگرێت . خوشەویستەکەم چاو پیکەوت کە ڕوومەتی خوی بە «شەوبەند» چارچیو داپۆشی‌بو . (٣) پێم‌گوت : خوشەویستەکەی ئیمانو دینم . من بەوچاوە جوانانەی تۆ . تەواشای دنیا . دەکەم . کەچی تویش دات پوشان ! (٣)- مەگەر خۆدا نەخواسە . ئازاریْ بەچاوانت گەیشتوە کەوا شەوبەندت کێشاوە بە سەریانا ؟

(٤) وەلاْمی یامەوە : بێ‌تاقەت‌و شەر فرۆش‌و خوێن مژن . ڕێبوارە زامدارەکان ئەکوژن .
(٥) ئەگەر بێ‌توو . وەکو جاران بەرەلاْیان بکەم . ڕێبواریْ لە ڕێبوارەکان بە زیندو نایەلّن .

٦ – مـــــنـــيچ جـــەو بۆنـــەمـــە حـــبوسم کـــە ردەن
هونـــــانیٚ نــــاحــــەق نـــــەیۆم وەگەردەن (٦)

٧ – سازانـــــام ئـــاخـــر حـــەقش بـــەدەستـــەن
ڕاویـــــار کۆشەن ئـــەنــــقـــەسش بـــەستـــەن (٧)

---

(٦) ئەوەتا منیش بەو بۆنەیەوە خستومەتە بەندیخانەوە تا خوێنیی ، ناحەق گەردنم نەگرێ ،
(٧) کە بۆم ڕوون بوەوە ، حەق بەدەستیەتی ڕێبوار کوژن‌و خۆی بە تایبەتی دای‌پۆشاوە ، قەناعەتم کرد .

ووشەکان :

ئارۆ : ئەمڕۆ (=ئەوڕۆ) . بەند : زیندانی (=سجون) . بەندکراو . نەی شەلاّ : خۆدا نەخۆاسە . هاتێشدا : پۆکەی : لەبەر ئەوە . ئاوردەن : هێناوتە . پێشدا : پەی‌یا (= بەسەریا) . بێ ئارام : بێ تاقەت . هونین : خوێنیی . دەردین : بریندار . ڕاویار : ڕێبوار . مەرخەس : بەرەلاّ ، ئازاد . هەردەجاران : جارانی کە . نمازۆ : نایەلّێت . سازانام : کە زانیم . ئەنقەس : عەمدەن ، تایبەتی .

١ – ئـــــارۆ وێنـــــــەی وێم دیم خـــــــەزانیٚ زار
بـــەنـــدیٚ بـــە زامـــەت جـــەورو جـــەفـــای خـــار[١]
٢ – ئـــــــەو جـــــــەدەردیٚ وێش بیٚ مـــــــەدارا بیٚ
خـــار چـــــەنگیٚ زامــــــەت لــــێش ویـــــارا بیٚ[٢]
٣ – بـــــــەزارزارەوە هـــــــەر وێش مـــــــەشانــــــا
جـــــەزامــــــەتیٚ خـــــار دووریش مـــــەن مـــانـــــا[٣]
٤ – خـــــار شەرمش نـــــەکـــــەرد جـــــەرەنگیٚ زەردش
تـــــا بـــــەجـــــەفـــــاو جـــــەور سەد پـــــارە کـــــەردش[٤]
٥ – (راستـــــــەن) جـــــــەوهـــــــەر کۆ دەردەداریٚ بۆ
زدەی زامیٚ سەخت نــــــــــیشیٚ خـــــــــــاریٚ بۆ[٥]
٦ – ئـــــــەویچ چون جـــــــەستـــــــەی من دەردەدار بۆ
یـــــا بـــــەی تـــــەور زەدەی زامــــــە تیٚخـــــار بۆ[٦]

---

«بێسارانی» لەم پارچە هەڵبەستە کومەلایەتیەدا ، هەستی ی ناسکی خۆی دەردەبڕێت و گەلایکی زەردی – دارێك کە بەهوی پیٚنەگەیشتنی ئاوو خواردەمەنی و هەرواهاتنی کاتی ی سەرماو وەرزی پائیزەوە لە لەقەکەی جویٚ ئەبێتەوە ، سرنجی ڕائەکێشێت و ئەلیٚ :

(١) ئەمڕۆگلایکی زەردو زەبونم کە میثالی خۆم بوو ، بینی ، کە ئەویش وەکوو من گرفتاری زەحمەت و جەورو جەفای هاوەڵەکەی خۆی بوو ، (٣) ئەو (=گلاکە) بە دەستی ئازاری خویەوە تاقەتی – لیٚ بڕابوو ، سەرەڕای ئەمەش ، دڕگیٚکی پیا چووبوو کە وەکوو چنگانە ، چنگی لیٚ هەڵیٚ پێکابوو ،

(٣) بەدەنگێکی زۆر زویرو دڵتەزێنەوە هەر ئەی ناڵاندو خوی ڕائەوەشاند ، تا بەڵکووە لەو زەحمەتە ،خوی دووربخاتەوە ، (٤)– بەلام ! ئەو دڕگە تا ئەو ڕادەیە دڵڕەق بوو کە تەنانەت شەرمیشی لە – ڕەنگی زەردی ئەو نکردو بەهەزار تەعذیب و ئەشکەنجە ، لەت و پاری کرد .

(٥) ڕاستە لە هەر شوێنیٚ ئینسانیکی بیٚدەسەلات بێت ، ئەبیٚ ئامانجی هەموو ئێش و ئازارێك بێت .

(٦) ئەویش ئەبیٚ وەکوو من ، هەموو کاتیٚ دەردەدار بیٚ یاخۆد بەم جۆرە گیرودەی زەحمەتی دڕگ بێت و لێکدانەوەی ووشەکان :

وێنە : وەکو . غەزانیٚ زار : گلای زەردی پاییز . زامەت : زەحمەت . بیٚ مەدارا : بیٚ تاقەت . خار : دڕگ . چەنگ : چنگ ، چنگانە . لێش و یارابیٚ : لیٚی هەڵپێکابوو . زار زار : بە ناڵەیەکی دڵ تەزێنەوە . مەشانا : ڕای ئەوەشاند ، پەلە قاژەی دەکرد .

دووریش مەنمانا : ئەی ئەویست دوور بکەوێتەوە . دوور بکەوێتەوە . پارە : لەت . کەردش : کردی . جەهەرکۆ : لە هەر شوێنیٚ . نیش : چز ، نوك . بەی‌تەور : بەم جۆرە . زامەت : دەردی سەر ، زەحمەت .

١ – ئـــــارۆشيــــــان ديم ڕەنگىٚ خــــــەزانــــــان

حـــالىٚ شان نـــيــــەن ئـــێمـــــە نـــەزانـــان (١)

٢ – ديم بـــــەتــــــەرزەوە خـــــەزانىٚ بـــــەى تـــەرز

تـــــەمـــــام حـــــالىٚ وێش پــــەرێم كــــەردش عـــــەرز (٢)

٣ – پـــــەرسام پــــــە چـــــێشەن ڵێ‌زەردىٚ‌خـــــەزان

وات مـــــەيۆم نـــــەخـــــاو تـــــەنـــاكى تـــــەرزان (٣)

---

دەردى دوور كەوتنەوە لە«يارو ديار» سەرچاوەى هەڵقوڵينى هونراوەى زوربەى شاعێرەكانى ناو
– كۆردەوارى بوە . فراق ، دوورى ، هيجران ، جيانى ، زۆرتر لە ووشەكانى تر ، بەكار هاتوون .
مەولەوى تاوگۆزى‌و ميرزا عەبدولقادرى پاوەيى ڕەنگ‌ێى لەو هۆنەرانە بن كە زۆر ئەم ووشانەيان ، بەكار بردوە . مەولەوى فارس . لە ديوانى «شنوى»دا ، قەسيدەيەكى ئێجگار بەناوبانگى هەيە كە لە مێژوى ئەدەبى كوردى‌دا تأثير نەبوە كە ئەڵىٚ :

بشـــــنواز نى چون حـــــكـــــايت مـــــيـــــكـــــنـــــد

وز جـــــدائى هـــــا ، شكـــــايت مى‌كـــــنـــــد ،

كـــــز نـــــيـــــســـــتـــــان تـــــا مـــــرا بـــــريـــــده انـــــد

ازنـــــفـــــيـــــرم مـــــردو زن نـــــالـــــيـــــده انـــــد .(تـــــاد . .)

واتە

بـــــيـــــســـــە لـــــە بـــــلوێر ، حـــــيـــــكـــــايـــــەت دەكـــــا

لـــــە جوىٚ بوونـــــەوەى شيـــــكـــــايـــــەت دەكـــــا ،

تـــــاكوو لـــــە وێشە ، مـــــنـــــيـــــان بـــــڕيوە

لـــــە ژن‌و لـــــە پـــــيـــــاو ، زكـــــيـــــان دريوە .(تـــــاد . .)

مامۆستا «بێسارانى»ش بە شێوەيەكى زۆر ڕێك‌و پێك لەم پارچە هونراوە كۆمەڵايەتيەدا ئەم مەضموونەى بەكارگرتوە :

(١) ئەمرۆ چووم تەواشاى ڕەنگى ئەو گەڵا خزانەم كرد ، ئەوەم لىٚ حاڵى بوو كە ئەوان مشتێكيان بەدۆنياوە نەماوە ، بەڵام ئيمە ئێستا بەمەمان نەزانيوە .(٢)تەكەم‌دا ، لاى گەڵايەكى زەردەوە كە شتێكم پىٚ‌بڵىٚ ! دەستى پىٚ‌كردو تەواوى دەردى دڵەكانى بۆم كرد . (٣)– ئانجا پرسيارم – لىٚ‌كرد كە : هۆى چيە ئێوە وا زەردو زايفن ؟ گۆتى وەڵڵا ئەوە ڕاستى بێت لە ، خەودا – بينم ئێمەيان لە لەق‌و تەرزى خۆمان جوىٚ كردەوە .

٤ - واتم ئـــێمـــەو تۆ هــــەردوو جــــەستــــەمــــان
ئــــێش مــــەکــــەران زام ،مــــاران گەستــــەمــــان [٤]

٥ - تۆ جــــبــــاجــــە تــــەرز، من جــــە بــــالأیێ
تــــەرتــــەر جــــە نــــەرگس، سەولێ ئــــالأیێ [٥]

٦ - داخێ جــــیــــایی نــــەوتولێ نــــەمــــامــــان
تۆ جــــەفــــاوت دی، من پــــەنــــەم ئــــامــــان [٦]

(٤) - گوتم ئێمەو تۆ هەروەکو یەك زارمدارین‌و برینەکانمان وەکوو یەك زۆخی لیێ ئەچێت . (٥)-تۆلەتەرز (=لەق)ی خۆت جویێ - بوویتەوەو من لە بەژنێکی تەرتر لە نەرگیس‌و جوان‌تر لە صنوبەرێ .(٦)-برینی بێدەرمانی- جیایی لە یارو دیار ، تۆ لە خەو بینیوتە ، بەلأم من بەسەرما تێپەری کردوە .
ووشەکان :
شیان : چووم . بەی تەرز : بەم وینە ، بەم جۆرە . پەرسام : پرسیارم‌کرد کرد . یەچێشەن : ئەمە چیە . مەیوم نەخاو : هاتوەتە خەوم . تەناکی : جیاوازی . تو جە خاوت دی : تو لە خەو بینیوتە . من پەنەم ئامان :- من بەسەرما تێپەری کردوە .

١ – ئـــارۆ خـــەزانیٚ دوور جـــەپـــای نـــەمـــام
زایفـو زەبوون هــــێجــــران سەر ئــــەنجام [١]

٢ – ئـــەویچ پـــەی جـــەستـــەش، مـــەنـــالاٚ بـــەزار
بـــە جـــەفـــای هـــێجـــران مـــەکـــەردش ئـــێقـــرار [٢]

٣ – پـــــــــەرسام هـــــــــەی زەدەی گەردوونیٚ بیٚ‌ڕام
زیـــنـــدەی بـــەخـــتیٚ شوم دوور جـــەپـــای نـــەمـــام ؟ [٣]

٤ – چ بـــەدبـــەخـــتـــیـــتـــەن کپـــێسە پـــێت ئـــامـــان
مـــەرنـــە خـــاوت دی دووری نـــامـــامـــان ؟ [٤]

---

(١) نەمام : دار . زایف (= ضنیف) : لاواز :زەبون : بیٚ‌پشت‌و پەنا . سەرئەنجام : ئاکام .
واتە : ئەمڕۆ چاوم کەوت بە گەڵا خەزانێکی لاوازو بیٚ‌پشت‌و پەنا کە دوور لە دارەکەی کەوتبو ، کە ئەمە ئاکامی ئەوبوو .

(٢) جەفای هیجران : ئازاری دوورکەوتنەوە . مەکەردش ئێقرار : ددانی پیا دەنیا .
واتە : ئەویش بە دەستی ئازاری لەشیەوە بە دەنگێکی دڵ تەزێن ئەی‌ناڵاندو ددانی بە ئازاری دوورکەوتنەوەی - خۆیا ئەنا .

(٣) زیندەی بەختیٚ شوم : گیان لەبەری چارەڕەش . پەرسام : پرسیارم کرد . گەردوونیٚ بیٚ‌ڕام : چەرخی گەڕاڵ .
واتە : پرسیارم لیٚ‌کرد : ئەریٚ هەی ژێر چەپۆکەی چەرخی گەڕاڵ ،گیان لەبەری چارەڕەشی دوورکەوتو لە قەومو هەواڵ ؟

(٤) پێت ئامان : لێت هاتوە . مەر : مەگەر . نەخاوت‌دی : لە خەوت بینی .
واتە :چ بەدبەختی‌کیت بەسەراهاتوە کە بەم چەشنە ئەدبینم ، تیایا ، خەوت بینی‌بێت کە لە کۆمەڵە کەت جویٚ بویتەوە ؟

٥ - واتش هـــــەی بیٚ دەرد دەروون پـــــڕچـــــە خـــار
سەرگەشتـــــەی هـــێجـــران جـــەفـــای ڕوزگار [٥]
٦ - یـــە هـــێجـــران کـــەردەن جـــە دەیـــدە کۆر بـــام
نـــەتـــەرز مـــەویـــنون نـــە بـــالای نـــەمـــام [٦]

---

(٥) واتش :گوتی . دەروون پڕ جەخار : دلّ پڕ لە درگ . سەرگەشتە : لێوە ، وێلّ .
واتە : وەلامی یامەوەو گوتی : بیٚعاری دلّ پڕ لە دەرد ، ئەی وێلّو لێوەی وەکوو مەجنون ،
ئەی - جەفاکێشی ڕۆزگار ،
(٦) کۆربام : کوێربم . مەوینوون : ئەبینم . بالاّ : بەژن .
واتە : کوێر بم لە چاوان ئەمە حالّە کە منی تێدام ، ئیٚشی جیاوازیە ، ئێستا نە ئەتوانم ئەو لەقەی
- ببینم کە پیٚیەوە وستابووم وە نە ئەو دارەی کە وەکوو دایکی من بوو .

١ - ئـــــارۆ خـــــەزانیٚ زەرد بـــــام ویـــــنـــــا
کـــــەفـــتـــــە بیٚ نـــــەگۆل تـــــافیٚ لال مـــــیـــــنـــــا[١]
٢ - عـــــەکسش دیـــــاربیٚ نـــــەگۆلیٚ ئـــــەوتـــــاف
چهان من مـــــەدیـــــام نـــــەرووی جـــــامیٚ ساف[٢]
٣ - شیـــــام هۆر گرتم دیـــــانیٚ پـــــیٚشدا
چهان کـــــاسەنی خوم ریٚزان بـــــەویٚشدا[٣]

---

(١) زەردبام :زەرد فام . زەرد رەنگ . وینام : چاوم پیٚکەوت . کەفتە بیٚ : کەوتبو . گۆل : گۆلاو .تاف (طاف) : شەلال . لالٚ(لعل) : بەردیٚکی بالی داره . مینا : سپیو ساف .
واته :ئەمرۆ خەزانیٚکی زەرد رەنگم بینی کە کەوتبوه نیٚوان . گۆلاویٚکی پر لە ئاوی سپیو ساف . ئاوی گۆلاوەکە وەکو لالی بەدەخشانی ئەدرۆشایەوه .کاتیٚ کە پژگی شەلالەکەی تیٚ ئەکەوت .
(٢) عەکس : ویٚنە .چهان : وەکو ئەمە . جامیٚ ساف : ئاویٚنەی بیٚ گەرد .
واته : ویٚنەی ئەو گەلا خەزانە لە گۆلاوەکەدا بە رِوونی تەواو . دیاربو . وابو کە ئەدگوت لەناو - ئاویٚنەیەکی بیٚ گەردا ئەیبینی .
(٣) شیام : رِۆیشتم . چووم . هۆرگرتم : هەلٚمگرت . دیانیٚ پیٚشدا : نواریم پیٚیا . ریٚزان :-رژاندویه . بەولٚیشدا : بەسەری خۆیا .
واته :رِۆیشتمو وەرمگرتو پیٚیا رِوانیم . وەکو ئەوه بو جامیٚ خۆمیٚ بەسەرخۆیا رژاندوه .
ئەم شیٚعرە لە نوسخەیەکدا بەم چەشنە هاتبوو :

شیـــــام هۆرم گرت . دیـــــام پـــــیٚشەدا
چهان چـــــەم دان بـــــەسەر ویٚشەدا
کە لەوه ناچیٚ دەستکاریەکی ناشیانە نەکرابیٚت .

١ - ئـــێم شەو من گریـــام خـــروس کـــەرد نـــاڵین
سۆب ئـــەو بێ نـــیشـــان ،من زۆخو بـــاڵین[(١)]

٢ - گریـــەی من جـــەداخ دووری کـــەسێ بێ
ئـــەو جـــەدەرد بێبـــاك ، وەش نـــەفـــەسێ بێ[(٢)]

٣ - نـــەسۆزا بـــە سۆز نـــە بـــە دەمـــەوە
نـــامـــا ، نـــەپـــەرساش بـــەدەردمـــەوە[(٣)]

---

ماموستا «بێسارانی» ئەو واقێعیەتەمان جاری‌کی کە بو روون دەکاتەوە کە بێگانە بەخوێش نابێ» «کەسێ پشتی - من ناخۆرێنێ مەگەر دەستی خوم» . و «تیر بێخەبەر لە حالی‌ی برسیە .»و دەیان لەم چەشنە ووتارە - گرنگانە کە تەجروبەکراون . شاعێرێکی فارس وەکو ئەوە بەزمانی مامۆستا بێسارانی قسەی کردبێت ئەلێ :

جۆدائی تـــانـــە یزفـــتـــەد . دووست قـــەدرێ دووست . کـــەی دانـــەد ؟
شکـــەستـــە ئۆ ستۆ خوان دانـــەد . بـــەهـــای مومـــیـــائی را .

واتە جیاوازی تاکە نەکەوێتە نێوان . دۆس بایەخی دۆس نازانێ مەگەر ڕان شکاو بزانێ بائی مومیاوی چەندە ؟

لەم پارچەدا . مامۆستا . کەڵەشێر تاوانبار دەکا کە وەکو ئینسانە سەرخۆشەکان . نەهاتوەتە سەری کە هەواڵێکی لێپرسێت .

(١) خرووس : کەڵەشێر . ناڵین : مەبەست خویندنی کەڵەشێرە . باڵین : سەرین .
واتە : ئەمشەو تا بەرەبەیان من هەر گریم‌و کەڵەشێریش هەر بو خوی ئەی‌خوێند . کەرۆژ بوەوە . من سەرینەکەم پربوو لە زۆخاوو لە کەڵەشێریش نیشانێ نەمابوو .

(٢) بێباك : بێخەبەر . وەش نەفەسێ بێ : کاتێکی خوشی هەبوو .
واتە : ناڵەو گرتنی من بەهۆی دوورکەوتنەوە لە خوشەویستێ بوو . بەڵام ئەو (=کەڵەشێر) . لەو هەموو - گرین‌و ناڵەی منە . ئاگادار نەبوو یاخود نەی‌دەویست ئاگادار بێت و بو خوی کاتێکی خۆشی ڕادەبوارد .

(٣) هاوڕێی غەم‌و پەژارەو سوتان‌و برژانی نەکردم وەتەنانەت نەهات بەدەمیشمەوە کە هەواڵێکم لێبپرسێت . ناما : نەهات . نەپەرساش : نەی پرسی .

٤ – وێنـــــەی بێ دەردان سەر وەخـــاك خـــیـــاڵ
تـــاسۆب من گریـــام، نـــەزانـــاش بـــە حـــاڵ(٤)

٥ – بێ‌دەردێ دەردش ئـــــــــەو سا دیـــــــــاردا
نـــاڵەش بێ پـــەروا ئـــامـــا بـــە شاردا(٥)

(٤) تا ڕۆژ بوەوە من گریم ، بەڵام ئەو وەکو بێ‌دەردان ، لەمن هەواڵێکی نەپرسی .

(٥) ئەو بێ‌خەبەر لەهەموو شتێ ، دەردی نەبوو و ئازارێکی بەخۆیەوە هەست نەدەکرد ، مەگەر ئەوکاتە . شتێکی لێ حاڵی بو کە لە ئاوایەکەیەوە هێنایان بۆ شار . ئاتجا ئەو کاتە ناڵەی لێ بەرزبوەوە وە دەردی دووری‌ی هەستکرد .

# تیپی – ب –

١ – بـــــــــــەدامـــــــــانت بۆ...
ساسووەیـــــــل دەستم بـــــــە دامـــــــانت بۆ [١]

٢ – ئـــەوسا جـــەیـــەمـــەن بـــەر ئـــامـــانت بۆ
ئـــەوەڵ ڕەشتـــــەی سەوڵ خـــــەرامـــــانت بۆ [٢]

٣ – سا سووەیـــــل سەرم نـــــەڕات تۆفـــــەیـــــل بۆ
ئـــانـــــە مـــەرەژی بـــــا بـــالأی لـــەیـــــل بۆ [٤]

٤ – خـــــــەزان زەرد مـــــــەبۆ زوو مـــــــەڕێز بۆ
لـــــــەیـــــــل نەمەڕێزو ، نەمە بـــــــێزیۆ [٤]

---

(١) دامان : داوێن . سووەیل : سۆهەیل : سووەیل . ئەستێرەیەکی زۆر گەش‌و ڕوونە کە لە هەوەڵ مانگی پاییز دەردەکەوی وە لە کۆردەواری‌دا ناوبانگی بەوە هەیە کە سێوە سورە ڕەنگی سووری خوی لەم ئەستێرەیە وەردەگریٚ . هەروا هەنارو بریکی کە لە میوەکان . جا لێرەدا شاعێر دەڵت بە داوێنی سووەیل دەبیٚ‌و لیٚ‌ی ئەپارێتەوە کە بەر لە هەموو شتیٚ خوشەویستکەی ئەو برەژیٚ

(٢) ئەوسا : ئەو کاتە . یەمەن : یەمەن ، وا بە ناوبانگە کە ئەم ئەستیرە لە یەمەنەوە هەڵدێت .
واتە : ئەو کاتە لە یەمەنەوە هەدیٚیت ، هەوەل شتیٚ ئەی ڕەژی ، با سەوڵی خەرامان بیٚ .

(٣) تۆفەیل : فیدایی . نەڕات : لە ڕیٚگەت . ئانە : ئەوەی . مەرەژی : ئەی ڕەژی .
واتە : ئەستێرەی سووەیل لە دەورت گەڕیٚم ، ئەوەی ئەی ڕەژی با بالأی لەیل بیٚ .

(٤) مەڕێزیو : ئەوەریٚ ، ئەڕێزی . نەمەبێزیو : نابیٚزیٚ . لەبیر ناچێتەوە .
واتە : خەزان زەرد ئەبیٚ‌و زوو ئەوەریٚ ، بەلأم لەیل ناوەریٚ‌و نابیٚزیٚ .

١ – بەی گشت دەردەوە . . . .
بەی گشت زامەوە بەگشت دەردەوە[١]
٢ – بەی جەستەی خەمین ڕەنگیٚ زەردەوە
سا جەنۆ قەبرم تازە کەردەوە[٢]
٣ – ئامانەت ئەوسا وەقەبرم بەران
نیشانەی جەستە (خەستەم) بکەران[٣]
٤ – بە وەڵگیٚ خەزان بپۆشان سەنگم
تا نیشانە بۆ جەزەردی ڕەنگم[٤]
٥ – کۆنەکەمان باوەران وەبەر
هەرکام خەمتەرەن بنیانیٚم وەسەر[٥]
٦ – بنیانیٚم وەسەر کۆنە کەمانیٚ
ئەو جەقامەتم دارۆ نیشانیٚ[٦]
٧ – تاوینان یاران چەفتی کەمانم
بزانان کوشتەی دەردیٚ خەمانم[٧]

---

(١) بەی : بەم . بەو . (٣)–خەمین : خەمگین . ساجەنۆ : هەمیسان لە نویٚوە . قەبرم : گۆڕم .
کەردەوە : کردیەوە . (٣) – ئامانەت : دەستم بەداوێنیت . ئەوسا : ئەو کاتە .
بەران : ئەبەن . وەڵگ : گەڵا . بپۆشان سەنگم : بەردی سەر گۆڕم داپۆشن . جە : لە
(٥) باوەران وەبەر : دەربهێننە دەرێ . خەم تەرەن :
بنیانیٚم وەسەر : بینیٚنە سەر گۆڕەکەم .(٦)جەقامەتم . دارۆ نیشانیٚ :–نیشانەیەك بێت .(٧) تاوینان : تاوەکو ببینن . بزانان : بزانن . کوشتەی : کوژراوی .

واتە : بەم هەموو دەردەوە ، بەم هەمو زامەوە . بەم دڵی پڕ لە غەمەوەو بەم ڕەنگی زەردو زایفەوە کە نیشانەی مەرگیان پێوەیە ، ئەوەتا گۆڕم دێتە بەرچاوان . جا دەستم بە داوێن‌تان ، ئەو کاتە جەنازەکەم ئەبەنە گۆڕستانو ئەویٚ بم‌نێژن . لەسەر گۆڕەکەمەوە نیشانەیەکم بۆ بکەن : بەردی سینە پۆشی گوڕەکەم – بە گەڵا خەزانی زەردی پاییز داپۆشن کە ئەوە نیشانەی ڕەنگی زافەرانیم بێت . کەمانێکی کۆنیش پەیا بکەنو بینیٚنە سەر گۆڕەکەم ئەویش نیشانەی چەمانەوەی – قامەتم بێت . تا هاوەڵان بێنە سەر گۆڕەکەمو ئەو کەمانە ببینن وە بەو بۆنەوە بزانن من کوژراوی غەمانم .
(خەم لەشێوەی هەورامی‌دا ، هەم بەمانای «غەم» . وەهەم بەمانای «چەماوە»یە .بەڵام بەداخەوە ئەو «جەناس»ە ، زۆر جوانە لێرەدا تیادەچێت .

